پێشکەشی ڕێی ئاشقان بێ چەپکێ خوێنی سورو ئاڵ
لێم قبوڵکەن، دیاری شوانە ئاڵەکۆکـــــەی پرچـــنم

ئەوبەرهەمانەش بەزوویی لە لایەن نوسەرەوە،دەکەونە بازار

---

* ( هێـــمن و مـن ) پەخشـــــان و شـــــیعر
* گوڵبژێنـــریک لە غەزەلەکانی(حافظی شیرازی )

## وەک پێشەکی

خوێنەری خۆشەویست ڕەنگە بێ مەیل نەبی کە کورد ئاسایی خۆمت پێ بناسێنم و بزانی کێم و چ کارەم. زۆر جار خۆشم بە خۆمم گوتوە، وەرە شەیتانی بەلەعنەتکە و نەختاڵێک لە وەزع وچۆنیەتی ژیانی خۆت بدوێ کەچی لە دوایی پاشگەز دەبمەوەو دەڵێم:

جا ئەوە خۆشم ناساند چ دەردێک دەرمان دەکرێ و کام برین سارێژ دەبێ. کەوابوو گلەییم لێ مەکە، کەراستەوخۆ، خۆم ناناسێنم، زۆر زۆر ویستت چاکەم لـەگەڵ بکەی بە هەستێکی کوردانە، شیعرەکانم بخوێنەوەو، رابزانە سەعاتێک بە تۆبزی بێکاریان پێکردووی.

هەرچەند ئاشکراوو روونە کەمن من کردن و دەربارەی خۆ ئاخافتن کارێکی چەتونە، بەڵام جاروبارشۆڕبوونەوە بۆ ئاخی ساڵانی ڕابوردوو، ڕەنگەبتوانێ، گرانایی باری دوور وڵاتی کەم کاتەوەو خەم و پەژارەی سەردڵانی غەریبایەتی بشواتەوە.

لە کۆنەوە گوتویانە بیری منداڵی تیژە، بەعاستەم و دوبەلا(ماسۆ)جێی لە دایک بوونم وەبیردێ کەماڵمان هاتۆتە هەمزاوایە( لە پێشدا لە ٥کیلۆمەتری جادەی مەهاباد ـ سەردەشت هەڵکەوتبوو کە پاشان وەژێر بەند ئاوێ کەوت و خەڵک چەند جێگەی تریان ئاوەدان کردەوە)و هەرلەوێ لەساڵی١٣٣٤ی هەتاوی ١٩٥٥ز کە مەدرەسە لە گوندەکەمان دامەزرا، من بە کەم تەمەنترین قوتابی وەرگیرام ونرامە بەرخوێندن. هەمزاوا، هەم لەبەرئەوەی مەکۆی عەولای بایزاغا سەرۆکی عەشیرەتی مەنگوربوو

و هەمیش نزیــک شاربوو، گوندێکی ئاوەدان و قەرەباڵغ بوو. ڕۆژنەبوو، تەڕەدەست و پاڵەوان و بەندباز، قام بێژ و چاوەش و لۆتـــی و ووڕچباز ڕوی تێنەکەن، قەت ڕۆژێکی بێ سەبر نەبووبن. زۆر بیرەوەری خۆشی ئەوکاتەم لەزەیندا، ماوەتەوە.

لەساڵی ١٣٣٧هـ ڕۆژێک لەناکاو حەسەن زیرەک وحەمەجەیران لەکلاسەکەمان وەژوورکەوتن. دوای چاک و چۆنی لەگەڵ ئاغا مدیرکە ئەوکات کاک سولەیمانی حەبیب پەنابوو، کلاسەکەمان بوو بە بەزم و چەپڵە ڕێزان. لەسەر داوای ئاغا مدیر گەرەلاوژە دەستی پێکردو دوای چەند کەسان نۆبە گەیشتە سەر من، کاتێ لە گۆرانیەکەم بوومەوە( ئاوەدان بـــێ بەردوکـــــــە، ئاوەکەی ساردوسوکە، یارەبی بەقوربێ گیرێ، لێی پەیدابوەچندۆکە ـ ئاوەدان بێ هــــــــەمزاوا دەڵێی حۆری لێ زاوە، کەلەکەی چەپم شکاوە، ئەوکچەبەمست لێی داوە)حەسەن زیرەک گوتی«ئەو ڕەشەیە شتێکی لێ دەردێ» . هەڵبەتەوا نەزانلدرێ کە بوومە شتێکی زۆر عەجایب، نەخێرنەوەڵلاّ لەکوردێکی سادەو ساکار بەولاوە نەبوومە چی تر. بەهەرحاڵ ئەوە یەکێک لەخۆشترین بیرەوەریەکانی سەردەمی منالّیم بوو کەوا ئێستاش دوای تێزیکەی ٣٠ساڵان، حەیرانی حەمە جەیران و گۆرانی«ئاوهەلاّت وڕۆژهەلاّت دای لە پردی مەهاباد چەندم حەول لەگەڵ دا توران لەگەڵم نەهات»ی حەسەن زیرەکم لە گوێدا دەزرنگێتەوە. وابزانم دوای سەردانێکی ترلە هەمزاوا، هەر ئەو ساڵی بووکە حەسەن زیرەک پەرەبوەی گەرمێنێ دەبێ و لە ئێزگەی ڕادیۆی بەغدا، بەشی کوردی، زۆربەی گۆرانیەکانی تۆماردەکا و پەرەی بە هونەرەکەی دە

دا. ئەوکات هێشتا مەلیک لەپەسەلی ئانی لە عێراق پاشایەتی دەکردەو هاتوچۆ و ئــــــەم دیو و ئەو دیو کردن ئاسایی بوو. هەرئەوکاتەی کە ماڵمان لە هەمزاوایە بوو،بابم بەرزۆژی مەهابادایە،لە گەڕەکی شوانان پارچە زەوییەکی لە میرزا موحەممەدی قادەرچاوورەقان (باوکی میرزا عەولای خەزوورم)شکستە بەلدی بەنێوبانگ،دەکڕێ و دەیکاتەخانوبەرە. بەرلەوەی ماڵمان بۆ هەمیشە بێنە شار،جاروبار بەتایبەت هاوینان منیان دێنایە لای باوکم کە خۆی لە کۆنەوە لەلای هەرمەنیکی دارتاشی و تەگەر سازی دەکرد.

یەکەم جار بە سواری وشتر و جاری دوهەم بە جێبێکی سەرئاواڵە کە هی ماڵە عەولای بایزاغای بوو،پێم نارەتە شاری مەهاباد و تا ئەو کاتی پێم وابوو کە دنیا هەر هەمزاوایە و بەس. دەورووبەری گەڕەکی ئێمە تا دەگاتەوە تاقەدار و پادگان و باخی شیر و خورشید،هەمووی مەزراو دێمەکار بوو. پاشان بە تایبەت لەزەمانی تیمسار کەریمی وەرهەرام کە نەخشەی شار گۆڕا و خەیابان لێ درا،شکڵ و قەوارەی ئەو ناوەش دیمەنێکی دی بە خۆیەوە دی و ووردە ووردەخانوو بەرەی نوێی لێ سازکرا.

لەو ماڵەی کە باسکراوهێشتا وەبەر خەیابانێ نەکەوتبوو. بابم ۆ ماوەی چەند مانگان، وەتاغ و خەلوەتێکی دابوو بە ژن و پیاوێکی کە نێویان مام حەمەد و خات نەزاکەت بوو. لەیەکێک ەو هاوینانەی کەلە لای بابم مابوو مەوە،دەمدی جاروبارمیرزایەکی ێو بە بزەی ئاماڵ کورتەبالای پۆشتە،هاتوچۆی ئەو ماڵەی دەکرد ەم دەزانی کە کوڕی خۆیانە،تا دەهات کتێبەکانی پێ لێک

دەکردمەوە و بە قسەی خۆش و ژیرانە ئامۆژگاری دەکردم. هەموو جارێ بابی هان دەداکە دەستمان پێ لە خوێندن هەڵنەگرێ. دوای چەند سالأن کە قامم کردەوە،لێم حالّی بوو ئەو میرزایە هەمان «عزیزی یوسفی»یە کە لە سالّی ١٣٣٨ی هەتاوی وێرای هەزاران کەس لە خەڵکی کوردستان بە تاوانی کوردایەتی و بیرو بڕوای ئازادی خوازی گیراو بوو بە قارەمانی گرتوخانەکانی قزڵ قەڵعەو بابل و قسرو ئێوین و کۆمیتەو بەرازجان...لە پێشوشدا چەند ساڵێک گیرابوو. لەتەواوی دەورانی دەرس خوێندنی خۆمدا ،شکڵ و قیافەو شێوەو ئاکاری ئینسانانەی ئەو قارەمانە شەرافەتمەندەم هەر لەبیر مابوو تا ئەوکاتەی کەلە سالّی ١٣٥٦ی هەتاوی لە دوای بەربوونی ،بە ئاوەدەنگی لە تارانێ پێیان شادو شوکور بوومەوە. بەلأم داخی گەورەو گرانم بەهۆی نەخۆشی دڵ زۆر نەژیاو ئاخر سەر لە یەکێک لەنەخۆشخانەکانی تارانێ لە ڕۆژی١٧ی جۆزەردانی سالّی ١٣٥٧هـ بەهۆی کەمتەرخەمی دکتۆروخەیانەتی کاربەدەستانی گوێ لە مستی سەربە ساواک،بۆ.هەمیشە ماڵئاوایی لێ کردین. ڕەوانی شاد و گڵکۆیەکەی پڕ لەگوڵ بێ.

لەساڵی ١٩٥٨ز(٣٨-١٣٣٧هەتاوی)کە عبدالکریم قاسم دژی مەلیک فەیسەڵ کودتای کرد،من لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی لە مەدرەسەی پەهلەوی دەمخوێند. هەرچەند ئەو زەمانی هارەم لە بڕەی نەدەکردبەلأم دەبوایە بەزۆری ڕۆژنامان بخوێنمەوەو هەرچۆنێک با، سەرەدەرم لێ دەرکردباو بۆ بابم گێڕاباوە. کاری من تەنیا حوڵجە کردنەوەی وشەکان بوو، لەوەزیاتر چیم نەدەزانی. کەچی شەوانە بە بیستنی سرودی خۆش خۆش دنیایێکم کەیف دەکرد. ئەوکاتی

زۆریان بە شاخ و باڵی عەبدولکەریم قاسمی هەڵا دەگووت و تەنانەت لەناو منالەسەدرەسەیانیش قاو بوو کە دەیانگـــــــووت کە للەی بە قەرافیلی دەبێ.. شتی ئەوهازۆر دەگوترا و دەبیسترا.

لەو سەرو بەندی دا رادیۆوەک کەرەستەیەکی پێویست بۆ بیستنی هەواڵ و زانینی باس و خواسی دنیایە،وردە وردە باو بوو بوو. ئەودەم رادیۆ بە پاتری کاریان دەکرد،هەر پاترییەی بە قەرا پاتری ئەمرۆی ئۆتۆمبیل دەبوو.جابزانە خۆی رادیۆیەکە چەند بووە.سەرەرای ئەوەش دەبوایە هەر ماڵەی ئانتێنێکی هەبایە تا باشتر ئێزگەکانی گرتبا.بابم چونکو خۆی نەجار بوو داری زۆر باشی هەبوو.باوەڕکە دار ئانتێنێکی لەسەربانی چەقاندبوو کە بۆ کاریتە دەبووکارم بەوەی نیە کە ئەگەر بەسەر کەسێک دا کەوتبایە قەت نانی زیندوانی نەدەخوارد. ئەو روداوەیش بە نۆبەی خۆی چاوو گوێی خەڵکی کردەوە و تەنانەت منی دم رووتی وردەڵەیشی گرتەوە.

تالێرە بەدواوە دامەزرانی ئێزگەی رادیۆ کرماشان و دەنگە زولاڵ و خۆشەکەی شوکروڵڵای بابان بوونە هۆی هەژان و هروژانی هەست و زەوقی سەردەمی منالیم.ئەگەر بڵێم یەکەم مامۆستای ەخوێندەواری راستەو خۆی تیف تیفە دەری زەوقی شیعریم بابم ووەو دوهەم مامۆستای دوراو دوری هاندەرم،بابان بوە درۆم ەکردووە.بابم قەت پرۆگرامی « ئێمەو گوێگرەکانی»بەخەتەر ەدەدا، ئێستایش خۆشی و زولاڵی ئەو پارچە شیعرەم لە گوێدا ەزرنگێتەوە:

موتریب وەرە دەستی من و دامانی وەفات بێ
سوتاێم بە مەستی مەیەوە دەنگی نەوات بێ
هەستە وەرە لەو جامی ئەلەستی بدە دەستم
بەستەی دەری گولزارە ئەوی مەستی سفات بێ
وەفایی

شیعرەکە خۆی هیچ کە جوانە،ئەو سەد هێندە جوانتری دەخوێندەوە،لەویش جوانتر فرمیسکەکانی بابم بوون کە هەموو جارێ سەرنجی منیان رادەکێشا.

جارێکی شوکروڵڵای بابان ئەو شیعرەی مامۆستا «هێمن»ی دەخوێندەوە کە دەڵێ:

بەهار بوو فەسڵی زستانم ئەگەر یارم لەگەڵ بایە
درۆیە گەر گوتویانە بە خونچێکی بەهار نایە

هێشتا پارچە شیعرەکە تەواو نە بوو بوو کە بابم فرمێسکەکانی بە لا چاویدا هاتنە خوار.پاشان بۆم دەرکەوت هۆی رژانی ئەو فرمێسکانە چی بووە.

بەڵێ ئەوکاتە کە هەرەتی دارە دارەو گاگۆڵکەی شیعریم بوو، نە رەورەوەیێک هەبوو کە دەستی پێوە بگرم نەرێنوێنێک کە ئامۆژگاریم بکا.زۆر جار بێ ئەوەی بزانم دەڵێم چی،لەخۆوە نارە نارم دەهات کە هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو.

باو بوو هەموو سیزدە بەدەران خەڵکی شار،رویان دەکردە پردی سوور و قۆپ یا قۆرغی مەولەوی،( ئەو دەم هێشتا وەبەر سەدێ نەکەوتبوون) هەرکەسەبە شتێکەوە دەخافلا،ئیوا هەبوو،گورزی بە فیتوان و گۆێن و رەبازێنی دەکردوئیواش هەبوو چەلەک هەمزەل و

خۆشا ڕەوکێن و کوێرکێن،ئێمەش تۆپ هەڵاکردێن و فوتبالێن.
ئەوە یەکەم نارە ناری ئاوکاتی منە کە تەنیا ئەودێرەم لە بیر ماوە:

عالەم دێنە سەر قۆپێ
دەکەن کایە بە تۆپـێ
یاخــوا دوژمن بتۆپێ
بەهاری ژین و شادی

یەکەم شیعری سیاسی من سالانی ٤٦-٤٧ی هەتاوی دەگرێتــــەوە کە ئەو دەم لــــە پۆلی شــــەشی ناوەندی دەمخوێند. ناخۆشترین و دڵتەزێن ترین کارەساتی کە بە چاوی خۆم بینیم و هەتا هەتایە قەت لەبیرم ناچێتەوە دیتنی تەرمی ڕوت و قوت وهەنجن هەجنی دەستەیەک لە ڕۆڵە ئازادیخوازەکانی گەلی کورد بوو کە لە شەقام و چوار ڕێ و مەیدانی شار،دەیان گێران و نیشانیان دەدان. تاکو خەڵک چاوترسێن بکەن. زۆرچاکم لەبیرە،لە چوارچرای مەهاباد، تەرمی گوللە دابێژی ڕۆڵەی بوێرو هەڤبێژ(مراد شیرێژ)یان بە نێردیوانی بەستبووە، لەپڕ هەڵی کردە باێیک و تەرمەکە داکەوت. بە چاوی خۆم بینیم هەرچی ئەفسەرو ژاندارم و ئاژانی کە لەوێ بوون ڕایان کرد. لە دڵی خۆمدا گوتم وەرە تۆبەشقی خودا بزانە دیلی چ نیزامێکی ترسەنۆکە و گەندەڵێن.

دوا بە دوای ئەو کارساتانە،وابزانم لە مانگی جۆزەردان بوو کە،تەرمی کاک «سولەیمانی موعینی»یان هێنایەوە ژاندارمەری مەهاباد، لە زۆربەی شارەکانی کوردستان گێرابوویان بەڵام لە مەهاباد نەیانوێرا لە ترسی خەڵک ئەوکارەی بکەن. ڕۆژێک لە

باغی گولان که لەگەڵ کاک سمایلی رەفیقم دەرس و دەورمان دەکردەوە، بیستمان کەوا کاک سولەیمانی موعینی لە گومبەزان دەنێژرێ. ئەو رۆژە سەرلە بەیانی ئاسمان ساو بوو لە پڕ هەورێکی رەش ئاسمانی داگرت و نم نم دایکردە باران. لەوکاتەدابە دڵێکی خەماوی و چاوێـــکی فرمێسکاوی، لەبن دارێکی رونیشتم وشیعرێکم گووت کە بۆ سبەی ئەو شیعرەم گەیاندە دەست دوو کەسان کە یەکێک لەوان «خانەی موعینی»بوو (بە داخەوە ئەویش دوای چەند سالان لە کوردستانی ئەو دیو شەهید کرا). هەرچەند شیعرەکە زۆر پتەو نەبوو بەلام دەست بە دەست گەرا. جا سەیر ئەوەیە کە حەمەدەمینی برام دوای ماوەیێک هات و گوتی وەرە شیعری شاعیرێکی ئەودیوت بۆ بخوێنمەوە کە دەستی پێ کرد دیتم هەر ئەو شیعرەی خۆمە.

دەقی پارچە شیعرەکەم لە مێژ ساڵە فەوتاوە و ئەوەی لە زەینم دا ماوە رەنگە ئاماڵ فەرقێکی لەگەڵ ئەوەکەی پێشوو هەبێ کەوا بە یادی ئەو شەهیدەنیشتمانپەروەرە لێرەدا سەرلە نوێ تۆماری دەکەمەوە:

ئاســـمانی شـــاری ســـابلاغ پڕ لە هەورو پڕ تەمە
ژیانی ئەمرۆی کوردەواری زۆر چەتون و ئەســـتەمە
دوێـــنێ تەرمـــی قـــارەمان و رۆڵـــەی ئازادیخـــواز
هاتەوە نـــێو باوەشـــی ئەو نیـــشـــتمانە پڕ خـــەمە
ئاســـمان رەنگی گرژ بوو وەختـــێ دیتی تەرمەکـــەی
بۆیە فرمێـــســـک دەرێژێ خۆی وەکـــو ئەو عالەمـــە
کاکە فایق دەستی هەڵگرت،واڵە ژینی خۆشی شـــار
ژیا لە رێی کوردایەتی،قەت داینەنواند ئەو پەرچەمە

پڕ بە دڵ دای یارمەتی جولانەوەی نەودیوی کـــورد
تا لە زیـدی وی نەیاران کەوتـــنە کایە و هەم هەمە
ناعیلاجی خۆی و دەســتەی هاتە ناوچەی مەنگـوران
دەورێـکی گیرا لە شـــۆڕش تاکو دوێـــنێ ئەو دەمـە
ڕۆژی هیوای کوردەواریم کەوتەوە ژێر هـــەوری ڕەش
بۆیە ئێســـــتا دڵ بەخەم هـــەر ناڵە ناڵ و پڕ تەمـە
باغی گوڵان ـ بەهاری ١٣٤٧ی هەتاوی

خوێنەری بەڕێز وا چاکە چێدی لەسەری نەرۆم و سەرت نەئێشێنم بەکورتی تاکو بۆم کرابێ شیعرەکانم لەناوکـۆڕو کۆمەڵی کوردەواریدابڵاو کردۆتەوە. بەڵام هەرکات ویستومە لە دەفتەرێک کۆیان بکەمەوە و ڕۆژێک لە ڕۆژان بە چاپیان بگەێنم. لە پڕ بەڵایەکی لابەلام بۆ نازل بوەو هەموو ڕەسەکانم لێ بوونەوە بە خوری. تا ئێستا چوار جار کۆمەڵە شیعرەکانم لەناو چوون. جاری ئاخر بەشی زۆری شیعرەکانم و هەروەها نوسراوێک و ٣٠-٤٠ پارچە شیعری وەرگێردراو لە غەزەلەکانی ( حافزی شیرازی)م لە بۆمبارانی ناوچەی بادینان ژارە خۆر کران و سەر بە نیست بوون. زۆربەی شیعرەکانی ئەو دەفتەرەی کە لەبەر دەستت دایە،تاق و لۆق نەبێ،هەمووی بەرهەمی ئەو ساڵانەی دوایین کە هیوادارم بەدڵت بێ و چێژی لێ وەرگری.

لەرێبازی شیعرو شاعریدا،لایەنگری هەمووچەشنە شێوازێکم چ کۆن و نوێ بێ چ سپی و سەربەخۆ،گرینگ ئەوەیە شکل و ناوەرۆک بۆ گەیاندنی پەیامی کۆمەلایەتی یا مەبەستی مرۆڤایەتی یەکتر تەواوکەن، شیعری بێ شکل و روخسارەوەک دوور کوژی نێزیک خەسار وایەوشیعری بێ کاکڵ و پەیام وەک بووکە چینی.

شیعر دەبێ خاوەن هەست و گیان بێ و ڕاگەیێنەری مافی ژیان.
شیعر دەبێ پێدا هەڵدەری خۆشەویستی بێ و ڕێ نیشاندەری
ئینسان پەرستی ...

تا هەستم نەبزوابێ قەت بە زۆری دەخۆمەوە نەنوساوم. زۆر جاران بۆدەنکێک وشەی جوان دەستەو دامێن داماوم. گەلێک جاریش بەهۆی ساوە ساو وشەکان لێم ڕەویونەوە و نەلواوە بیانوسمەوە. سالێ واش بووە خۆم لاساریم گەیاندۆتە ئەوپەری بێعاری و لە شیعرەکانم نەبان بووم و بە چەپۆکان دامگرتوون. سالێ واش هەبووە پەری شیعر لە خۆرا لێم زیز بووەو هەرچی کردومە بۆم نەهاتۆتە ڕەدایە. جارناجاریش لەوی نازو لەمن خواز دەنگمان گۆڕیوەو بەســالێش یەکترمان نەدیوە. ئاخر جار، قەبرەکەی پڕ لە نور بێ، مامۆستا هێمن دەستی لە دەست یێک نایەوەو ئاشتی کردینەوە وابزانم ئەگەر ئەو شاعیرە خۆش زەوقە لە عالەمی شیعرو شاعیریدا بەربوانی نەکردایە بۆ هەمیشە هەناسە سارد دەماینەوە.

تۆبڵێی لە عالەمی سیاسەتیشدا ناوبژی کەرێ هەبێ و چیدی نەهێڵێ ساواو زارۆکمان بە ڤینگە و قرمژنی ڕەگباران لە خەوی شیرین ڕاپەرێ و بە دوکەڵی باروت و ژەهری بۆمباران شارو لادێمان ڕەش هەڵگەڕێ و کوردی بێ تاوان دەستە دەستە قڕ کرێ... یا تۆ بڵێی بەشەرییەت هەروا لە گوێی گادا دەخەوێ و لە عاست ئەو هەموو کارەساتەی کە دەرحەق بەگەلەکەمان دەکرێ، خۆ گێل کاو دەنگی لێ نەیەتەدەرێ... بڵێی ئۆخژنێکمان بێتەوە بەرێ؟

خوێنەری ئازیز

لە کانگای دڵەوە حەزم دەکرد لە هەلومەرجێکی ئاسایی و لە کۆمەڵگایەکی ئینسانیدا، دوور لە هەرچەشنە شەڕو شۆڕ و خوێنڕێژی، جینایەت و کارەسات و پیاوکوژی لە بەرامبەرت ڕاوەستابام و شیعرم خوێندبایەوە، تۆش بە دنیایەک زەوقی کوردەواری بە هانام هاتبای، هەڵت سەنگاندبام، هانت دابام و ڕێنوێنیت کردبام. بەڵام داخەکەم لەمێژ ساڵە لەو هەلە بێ بەری کراوم و لەو خۆشیە بێ بەش.

هێرش
ڕێبەندانی:١٣٦٨ی هەتاوی . ١٩٩٠ز

## بم خــــوێنـەوە

وردەوە ئــەی خوێـــنەری ئازادیخــــواز
تا لەگەڵ تـــۆدا بکــــەم رازو نــیاز
ئــەی ئەوەی وەک من ئەتۆش دەردت هەیە
دوژمنێــکی رژدو نامـــــەردت هەیــــە
ئەی ئەوەی بەدزی لە ســـــوچێکی جیــهان
رادەبوێری دڵ بە خــەم کــــات و ژیـــان
ئەی ئەوەی لایەنـــگـــری مــــافی رەوای
لاگری خەڵکـــی هــــەژارو بـــێ نەوای
ئەی ئەوەی شــــــەو تابەیانی ناڵــــەتە
والە دەســــــت زورداری زاڵــم زاڵەتە
ئەی ئەوەی چــقڵت لە چاوا رۆچـــــوە
کۆشکی ئاواتت لە نــــاوا رۆ چـــوە
ئەی ئەوەی ئاســـــــودە نەژیاوی دەمێ
غەیری غەم نەتبوە شــــەوانە هاودەمـــێ
ئەی کە زۆر تاسەت بەدڵ ما چـــت نەدی
قەت لە لێوی شادی یەک ماچـــت نەدی
ئەی ئەوەی ئاوارە بـــووی لێـــرەو لەوێ
ئەی کە وەک ئینســــان ژیانت خۆش دەوێ

ئەی ئەوەی کــــوردانە دەت چەوسـێــنـنەوە
ســـــاتــــێ دەتنـــێژن دەمێ دەت ژێننەوە
گــەر برین لێم هەڵدەدا، زوو زوو چـــمە؟
بیری یەکســــانی لە ژیانا ، ســـوچمە
تۆ بڵێی دەنـگـــم بە مـــەردم رابگـــا
لـــــەم جیهانە کەس بە دەردم را بگـــا؟
من هەمە پرســـــێک و تۆ جوابم بەرێ
تاڵــی غـەیری تاڵـی کــوا؟ دێنــێ بــەرێ
باخی ژینــم گـــەر دروی خــــەم دەردەکـا
گوڵــرنی یاخێـــم لەبــەردەم دەردەکــــــا
فەرمـــــوو بــۆتـــۆ وازە ، ئـازادی وەرە
ســـەیریکە گــەر تاڵە یا شـــــیرین بەرە
دوای تەماشـــا ،بگرە پاشـــان رەخنە لێم
ڕەنگ و بۆنی چۆنە ورد ورد بێژە پــــێم:
شیـــــعرە یا هەروا ، ووتەی بـــێ مایەیە
یــانە لەحـنی دڵگـــــــــــری لای لایە یە
شـــــیعر ەیا هەر پچ پچی سەر سفرەیە
یا ، خـــوناوی خـــــەمرەوێنی خومـرەیە
شــــــیعرە یا رەنگی هەژاری برسـیە
یانە، دەنگـــی رەنجەرۆی ژێر کورســــیە
شـــبعرە یا غەوری دڵی چەوســـــاوەیە
یا، دەنا، قیـنی لەخەو هەڵســـــــــاوەیە

شیعره یا، تک تک خەناوی پەنجەیە
یا سرودی لاوی ژێر ئەشکەنجەیە
شیعره یا هەر برک و رەنج و نالەیە
ژانی شانی کارگەر یا پالەیە
شیعره یا ، ئاخرنیگای سەر پەرگەیە
یانە ڤینگەی گوللەیی پێشمەرگەیە
شیعره یا سرتەوچپەی جیژوانە دێ
یانە، خشپەی پەنجەفی دۆی جوانە دێ
شیعره یا پشکۆی بەتینی سەر دڵە
یانە ، نەغمەی بولبولێکی سەر چڵە
شیعره یا تۆڵەی گەلێکی بێ بەشە
یانە گفتی شاعیرێکی سەرکەشە
شیعره یا ، ئاسۆرو کوان و وەرهەمە
یانە ، هێندێک دێری دەرهەم بەرهەمە
شیعره یا هالاوی گەرمی سینەیە
یانە، هەستی هاودەمی دێرینەیە
پێم بڵێ ئاخۆ لەمانە کامەیە
شوێنە ؟ یا ئاوی چاوی خامەیە
گیانەکەم نا.. پاکی ئاخ وداخمن
بەرهەمی نوێی باخی شینی ئاخمن

نوختە نوختە، خەڵت بەخەڵت بخوێنەوە
قەترە قەترە خوێنە لێم ئەتکێنەوە
بەم هەموو خوێنانە دێم شادیم دەوێ
بۆ گەلی ژێر دەستە ئازادیم دەوێ

مەرگەوەڕۆک : بەهاری ١٣٦٥

# شەو

ئەوساتەی کە شەو کپ و بێدەنگە
خەیاڵ خەواڵووی ژیانی بێرەنگە
ووشە ئاگرە، شیعر تفەنگە
ئازوو بیهاوێنی، وێستێ درەنگە

## پەندی دایک

هەستە دەرەنگە زۆر مەنو رۆڵە
لە دوژمنی خۆت بستێنە تۆڵە
رۆڵەی ئازیزم ئەی تاقانەکەم
ئەی وردیلانەی خشپیلانەکەم
ئەستێرەی گەشی شەوگاری ژیانم
گزینگی سوزنگەی لای بەر بەیانم
چاوت هەڵێنە سەیری دنیا کە
بۆ دوا رۆژی خۆت ، من دڵنیا کە
لە گوێ بسپێرە تۆ بەدڵ پەندم
چاکەی تۆم دەوێ رۆڵەی دڵ بەندم
پەندی دایکی خۆت قازانجی تۆ بێ
خوێندن وخەبات ئامانجی تۆ بێ
ئەمڕۆ نەزانین رۆڵە بەلایە
پیاوی هیچ نەزان ، چی لە دەست نایە
هەستە بزانە دنیا چ باسە
دۆست و دوژمنی گەلت بناسە

* * *

رۆڵەی ئازیزم ئەی جوانتر لە گوڵ
هەتاوی هیوای ئاسمانی دڵ

ئەی خامەی دەسـت و هەسـتی بە تینم
تـاقـە بەرهەمـی ئەوینـی ژینـم
شـیرم داوەپـێت بۆ هـەوڵ و خەبات
ئەوەک لـە قـوژبن لـوت داژەنی مات
تۆم گـەورە کردوە تۆڵـە بسـتێنی
ڕەگـی داگیـرکـەر لە بن دەربێـنی
گـەر تـۆ وانەکـەی خەیـاڵت نەبـێ
شـیری پاکـی مـن حەلاڵـت بیـێ
دیسـان پێـت دەڵێـم ڕۆڵە بە ووردی
لە بیـری نەکەی ڕێ و شـوێنی کوردی
وەبیـر بێـنەوە لانـک و دەسـرازە
تایبـەتی کـوردە ، کۆنـە ئـەو ڕازە
بەویـت سـویند دەدەم لەگـەڵ لای لایە
لە قسـەم لانەدەی تـاقـانەی دایـە
دەهەسـتە، هە ستە، وەختێتی هەسـتی
بسـتێنی مافـی ڕەوای سـەربەسـتی
* * *
ڕۆڵـەی ئـازیزم باوانـی دایـە
وە دایـکت کـەوێ هـەرچـی بـەلایـە
تـازە فێـر بـوبـوی تـۆ دارە دارە
کـەوا ، بـوو بـە باو پـەت و سـێدارە

لەوساوە پۆل پۆل دەکوژن لێمان
بە هیچ حیسابێ هەڵناکەن ونمان
ئێمە هەردومان باوک کوژراوین
لە هەردو بابان ، هەر ئێمە ماوین
یەک هەڵواسرا، لەچوار چرایە
یەکیان راو نرا بۆ ناو چیایە
کورم تۆ رۆڵەی ئەو دو بابانەی
تۆڵە ئەستێنی خوێنی ئەوانەی
دەهەستە هەستە درەنگە رۆڵە
بمرە لە پێناو ئەو خاک و خۆڵە

* * *

دیسان پێت دەڵێم پەندی بەکەڵک
هەرگیز بەرنەدەی تۆ لانی خەڵک
کەسم بابی تۆ ئازاو دلێر بوو
لەناو مەتەرێز رۆڵەو ێوێریوو
دەزانی رۆڵە مەتەرێز کۆیە
بیرێکی قوڵی شۆرشی نوێیە
هەر مەتەرێزێک پڕ دەبێتەوە
چەپکە گوڵێکی لێ دەروێتەوە
ئەوەی لە هەموان گەش و جوانترە
رەنگی سورترو گەڵای پان ترە

ئی باسی خوێنە لەوێ ڕژاوە
ڕووی کەژو چیای ، پێی سوور کراوە
هەستە ڕاپەڕە ڕۆڵە بە یادی
مەهێڵە سیس بێ گوڵی ئازادی

* * *

مەهاباد ١٣٤٩

# سرودی سور

*بۆ «حەمید»ی قارەمان*

بە ئەزمانی بڕاوی بێ زمانیم
بە ئەندامی لە نێو خوێندا شەلاڵم
بە سینەی کون کونی جێگەی «ئەرانیم»
بەرامبەر دوژمنی خوێنڕێژی زاڵبم
لەسللۆلی کپ و خامۆش وبێدەنگ
کە تێکەڵ خۆڵ دەبێ ئاوەنگی خوێنم
بە ئەسپایی گەرم ، تک تک ، بە ئاهەنگ
سرودی سوری سەرکەوتن دەخوێنم

* لە زمانی رۆڵەی قارەمانی سنەیی «حەمید» گوتراوە.

## هەرچی کە هەم هەم

دەرمانە دەڵێن ماچی دەمی سەردەم و دەم دەم
بۆ زامی بەژانی دڵەکەم، کەم کەم و جەم جەم
ئەوساتە کە بمژم گوڵەکەم شەونمی لێوت
بەم لێوە کە تا هەم لە مەی و بادە نەدەم دەم
ئەو ئارەقەیەی دەتکێ لەسەر قوتری مەمانت
دێنێ بەمە قەترێکی ، هەموو کەوسەرو زەم زەم
لای شەو، وەرە نێو شاری دڵم ئەی پەری شادی
یا تاوێ نەوێرێ کە بیێ دەست بە یەخەم خەم
جوانێ کە نەپرسێ بە وەفادادی هەژاران
لەو شارە بەکێ چارەیی دەردی دڵەکەم کەم
بۆ مشتنی خوێنم ،دەگەزێ لێو و کەچی من
بەم روحی بەسەر لێوەوە، زیاتر بە پەلەم لەم
مەم نوارە یە ساردی نەوەکو بتگرێ ئاهەم
ئاورکە دەیە سینەم و هەر دەنکی وشەم، شەم
سەربازی رنگەی عیشقم و، هەم سازم و هەمراز
گوێ نادەمە سازندە برۆ ، هەرچی کە هەم هەم.

سالی ١٣٥٢

## بۆ گەلانی ئێران

لاگری مافی هەژارو رووت و قوت و بێ نەوام
دوژمنی ئینسانی پەست و هەلپەرست و لا بەلام
چێژی رزگاری گەلان تاحەز بکەی شیرینە لام
شاعیرێکی ماف خوراوی گۆزەپانی چوار چرام
تا دەژیم هەر تێدەکۆشم من لە رێی مافی رەوام

* * *

ئەی گەلی ئازاو ژێردەست،دەست لەناودەست هەستەوە
دژ بەوانەی کەولی سوری خوێنرژیان راخستەوە
بۆ سرۆکی ، موی بنۆکی دەوری شایان رستەوە
دەستی ئازادیان لە پشترا ، پێ گرێ داو بەستەوە
ئایەتوڵلای موفتەخۆرو حۆقە بازو زگ زەلام

* * *

وەک گورگ خۆیان حەشاردابوو لە نێو پێستی مەڕێ
چاوەروانی دەرفەتێک، مێگەل بەرەو مۆل داگەرێ.
خەلکی چەوساوو هەژاریان هێندە تێن دا، بۆشەرێ
رەورەوەی رزگاریخوازی شۆرشیان لا دا لە رێ
دارو دەستەی خۆ فرۆش و کۆلکە ئاخوندی نەفام

* * *

کوانێ ئەو وەعدەی کە دابووت تۆ لە پێناوی گەلا
گفت و لفتی مینبەرت هەر باســــی خوێنە ئەی مەلا
بەســە شــەرمێک بتــگرێ ،ئەی هیچ نەزانی لابەلا
خەڵــکی ئێران نایەوێ، ئەفغان و قــودس و کەربــەلا
دینی تۆی خوێنرێژی زاڵم، حیکــمەتی شەرع و کەلام

* * *

سەد ئەوەندەش بۆت بکێشی کۆنە داو بازی « سیا »
رێوشــوێنی راووکوشــتار ، نەخشــەیی فێڵ و ریا
رووەشــی هەر بۆ قــەلە بخزێتە نێــو پەین و شــیا
نایەتە نێو داوی تۆ هەرگــیز هەڵوی دوندی چیــا
پێت دەڵێ : من عاشقی کوێســتانی بەرزو با سەفام

سەرستور: بەهاری ۱۳٦۲

## قــوماری دڵ

هەتا جوانی لە کوردستان بە رەوتی بەژن و باڵا بێ
دەبێ هەردەم لەسەر باڵات، خەبات و بگرو هەڵلا بێ
دەسابۆ خاتری رەش پۆشان،مەکە بەر،بەرگی کەسک و سور
دەدا بیانو بەدەس دوژمن کە باڵا چەشــــــنی ئاڵا بێ
لە خوارووی خاوەری چاوت چەلێ نەمدی گزینـــگی روت
کە زوڵفی لوڵ و ئاڵۆزت لە دەوری وی نە هالابـــــێ
بەرەو زەردی دەچێ رەنگم، بە لیمــۆ چـــاو بژیم تاکەی؟
نەکا ، باغی بە روســـینەت بە ئاهی من بەرەڵلا بـــێ
وتم :ناشــێ لە تۆی جوانچاک جــەفاکاری و دڵ ئازاری
لە مێژووی عیشــق و دڵداری ، گوتی: کێت دی نە ناڵابێ
کە بێ... دەنگـــی زرەی گوارەت لە جێــژوانێ بەڵێـنی بێ
قەڵای پاوانـــی شــەوبانی ، بروخێـــنم لــــە پــۆڵابێ
قرەی ناوێ قوماری دڵ کە باسی سەربێ بۆ ســــەردار
چ ،ســەربەرزە لەرێی عیشــقا ســەرێ دڵخوازیمەڵلابێ.

تەورێز: ساڵی ١٣٥١

# نەورۆزو کورد

نەورۆز ڕەمزی ســـروشتە
ڕۆژی ژیـــانەوەی گشـــتە
نوێ کـــەرەوەی جیـــهانە
بوژێنـــەری ژیـــــانە
بێ گیانێکی گیـــان بەخشە
نوێخوازێکی خۆش نەخشە
پەیـــکی پەری ئەوینــــە
دەنگی میـــژووی خوێنینە
ئیکســیری ژیانی نوێ یە
هـــەزار بەڵێـــنی پێ یە
دابی دێـــرینی کـــوردە
جێژنی درشــــت و وردە
ئـــالآ هەڵـــگری دادە
پیرە گـــەنجێکی شـــادە
یەکەم پێشـــمەرگەی وەرزە
ئاشـــتیخوازی سەر عەرزە
ماکـــەی نـــورو ئاگرە
ئەســـــتەم و خۆڕاگرە

ئەشکەنجە نایتەزێنێ
سێدارە نایبەزێنێ
نە شمشێری خوێناوی
نە سەد بۆمبای ژاراوی
نە فیڵ و دەهۆی بەدکار
گێژەڵوکەی ڕۆژگار
ناتوانن ڕێی پێ کل کەن
پەتی دیلی لە مل کەن
ئازاو ئازادی خوازە
ڕەندو ئینسان نەوازە
ناناسێ زەوی و زەمان
چەشنی کاوەی قارەمان
هەموو ساڵێ بەهاران
ڕوو دەکاتە هەزاران
دەڵێ: پیرە نەورۆزم
دۆستی کوردی دڵسۆزم
مژدە هێنەری شادیم
ڕازێنەری ئازادیم

* * *

## خــــەلات

پرسیان لە قازی بەســـەر دارەوە
ووشەی کوردستان بەســەر زارەوە
چ بو تاوانت ، گوتی: چوار چـرا
چاکترین خەلاتالەدەریـــــارەوە*

* مەبەست بارەگای شای پێشوی ئێران حەمە رەزا شایە .

# چیمەن*

لە هەڵپەرکێکی دڵگیری شەوانە
بە ئەسپایی کچێکی ژیکەڵانە
بەری هەڵدا گەری گەرمی زەماوەند
بژەی نازی دەهاتێ چاو بژانە
بەبەر چاوی گەلێک لاوی زراو چوو
نیزیک بزوە لە هێمن دڵبەرانە
وەکو تاوس لەلای هەڵنیشت و پێی گوت:
گەرەکمە شێعری بێژی ئاشقانە
کەوا بیوەم بەرەو کوردستان بە دیاری
کە نەچمەو، دەستی خاڵی لێرەکانە
دراوە سەرلە نوێ هێمن گەمارۆ
گەمارۆی ئەم کەرەت کوا وەک چەلانە
هەتا دوێنێ خەفێ و پۆلیس و ژاندارم
وەرە پێتوارە ئاکاری زەمانە
کەچی ئێستا ئەسیری کیژە کوردێک
چەتونە لێی قوتاربێ، بەم زوانە
ئەویش کیژێ کە وەک پرنۆیە بالای
چما دەبزێوی هەستی شاعیرانە

* * *

هەڵیگرتم خــەیاڵــی وردو ناســـــک
لــە حاڵێــکا کە دەدوان ئــــەم دوانـــە
بەمن دەتگـــوت بەیانە گوڵ دەپشــــکوێ
خـــوناوەی ناز، دەبارێ لـــەم دەمـــانـــە
ســەرم ســـوڕما لە کـــارو باری گردوون
لــە پایــزو بەهـــــــاری هاوینـــانە
لە نێوان چیـــمەن و زەردێ چ ســــەیرە
گزینگـــێک و هەناســـەی پایزانــــــە
* * *
مەلی شێـــــعرم کە دی ئاونگی گۆنای
لە ســــــوێیان لەنگەری گرت لەم بەرانە
بەترس و لەرزەوە پێم گوت: کچی شـــۆخ
بەشــــاگردو چکـــۆڵەی ویم بزانـــە
ئەگەر چی لام گرانە وەســـــفی جوانیت
رەچاویش کەم رەوشـــتی «هێمـــن»انە
دەبێ بگرین کە کـــوردین قەدری میوان
دەخیلت بم نە رەنجــــێ لێـــم بەمانە
نەوێرم چاو لە چاوت کەم چ مەعلـــــوم
کە مەستی ژوانە یا کوشتەی ســــەرانە
بڕۆت گەر تێک بنێی دنیا دەشـــــێوێ
بە تیرێــــکی کە دەرچـــێ لـــەم کەوانە

دەترسێ دڵ وەکو گوارە لە زوڵفت
نەوەک بخرێتە ژێر پێ کاتی شانە
لە تاوان قافیەم لاسەنگ و سوکە
لەوەند، سەنگی قیافەی تۆ گرانە
بەکام واژە بنووسم رەوتی بالأت
کە دەبزێوی بە عاستەم ئەم مەمانە
قەدی بەرز و نیگا رەمزو کەوی تەرز
چ خشپیل و بەناز و خنجیلانە
گزینگی دوندی ئارێزە بزەی تۆ
کە زیندو راگری روح و دڵانە
لەمە زیاتر چ بێژم چیمەنی جوان
چیدی مەگرە بە مامۆستا بەهانە.

گەلاوێژی ۱۳۵۸

---

* ئەو پارچە شیعرە کاتی خۆی نیشانی مامۆستا هێمن دراوە (لەجێی خۆی باسی لێدەکرێ )بۆیە لە خۆش ترین بیرەوەری یەکانی من بە حساب دێ ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بڵێم ئەو شیعرەکاتی خۆی،برادەرێک لە چاپی دابوو دیارە زۆرکەمو کوڕی هەبوودوای چندساڵ تێپەربوون وهەروەها نەبوونی ئەم شیعرە لەلای خۆم،بەزەحمەتێکی زۆر،سەرلە نوێ بۆم ساخ کرایەوە،جابۆیەرەنگە لەگەڵ ئەوەکەی پێشوجیاوازی هەبێ.

## ئێـــوارە

*بەیادی شەهید جەلال*

ئێوارەیە...
خۆر ڕوو زەردو بزرکاو
وەک کیژێکی چاو خومار
قژ ئاڵۆزو تێک ئاڵاو
پەرۆش و مات و هێدی
ڕێ دادەگرێ سەرەوخوار
بەرەو جێژوانێکی دی...
* * *
ئێوارەیە
ئاخ لە داخت ئێوارە
لە هەرچی رادەمێنم
هەر ڕەشایی دیارە
تەمی خەم و پەژارە
وەک جەللادێکی جل ڕەش
دمبا بەرەو سێدارە
هەرچی کە دەنگ هەڵدێنم
ووشەی«بەیانی سپی»
وەک گوللەیێکی گەرم
لە گۆرەپانی کپی
دەنگێوێ کەللە سەرم .

# کاکی کورد

کاکی کورد گوێ بگرە لێم، با پێت بڵێم چەند پەندی باش
هیچ گەلێک رزگاری نابێ ، قەت بەرێی چەوت و بەلاش
تۆ کە رێگات بەردەلانە، مەبرە تەنیا کوێرە رێ
تاکو تەتیا ، بالە ناکاو، بۆت نەکا کاریێ خوداش
چاو لە مێژووی راپەرین کەو دەرسی عیبرەت وەرگرە
رەورەوەی مافی رەوای گەل کێیە دەیکا وردو خاش
شۆرشی سالانی رابردو،وە بیر خۆت بێنەوە
تەرمی سەد رۆڵەی شەهیدی روت و قوت و قاش قاش
بۆ مەبستت پشت مەبەستە قەت بە هێزی هەلپەرست
خانی زگ زل، میری ملهوڕ، شێخی دوو ڕووی کۆنە جاش
دەتکەنە گۆپالی خۆیان بۆ مەبەستی پاشەرۆژ
وانەبێ کوانێ بە لێشاودەتدەنێ پارەو مەعاش
تا لە موچەی ناوچەکەت نەتبێ ، چەم و سەرچاوەیەک
قەت بەلافاوی بەهاران هەڵمەبەستە کاکە، ئاش
ئەو گەلەی بێتو نەزانی، یارو دۆخی هاوچەرخ
سەد ئەوەندەش گورج و گۆڵ بێ هەر لە پاشەو هەر لە پاش
داشەکانت هەڵمەکە بێ نەخشەو بێ پشتیوان
دامە باز هەردەم دەبێ وریابێ کاتی داش بە داش

پێم « سەگی زەردیش برای کاکی شوغاڵە» وەک دەڵێن
پەندی کۆنە «دزم کە دزم بێ ساز دەکا بۆ خۆی کەلاش»
باشترین رێگات بەرەی خەلک و خەباتی هاوبەشە
بۆ نەجاتی خۆت لە داوی دوژمنانی دەم هەراش

سنه: ۱۳۶۱

## دێـــــــوه

کاتێ که شەو پەرستان
له غاری ڕۆژ ئاوایە
پەیتا پەیتا لە ناکاو
بەری ئاسۆم لێ دەگرن
ڕەش دەکەن ئاسمانێ
کاتێ کە هەلپەرستان
بەزاری وەک زوڕنایە
بە بیری تەسک و تاساو
چاوی قینم تێ دەگرن
هەڵدەبەستن بوختانێ
منی شێت و هەڵوەدا
بە نێو دۆڵی ڕەزاندا
بە بەرچاوی ئەواندا
بە ئێوارێکی پاییز
بریندار و ئەویندار
دێمەوە لای تۆ جوانێ
چۆن ناکەم جێژوانێ...

پاییزی ١٣٦٣

# شینی شاعیر*

هەمە هێــمن ســـلاوو مەرحەبایـــــی
کـەوا قوڵ قــوڵ لە نێو دڵ هەڵقوڵیــــوە
دەکەم یادت لەبیــــر ناچــی دەمــێ تــۆ
کە هەردەم ئەو دەمەی من پێــــــکەنیوە
لە دووریت ئەی گـــــوڵی گوڵزاری موکری
عەلی شــــیعرم پەڕو پۆی هەڵــــــوەریوە
ئەمن چ بکەم لەگـــــــــەڵ کاری زەمانە
کـــــــە تۆی ئاوا ، لە ئێـــــمە دابریوە
بـــــەکەم بێ زوورەشــــی وەک بەکرە شۆفار
کە، زی دووری لـــــە نێوانمـــــــان تەنیوە

* * *

لە شـــــــینی بانەدا بیــــــستم بەهاری
کە شــــیعرێکت بە فرمێســـــک نوسیوە
لە شیـــعرو شـــــاعیری ئوســـتادی دیارە
لەنێـــو گەڵ نرخی تۆ ســــەد هێندەو نیوە
بەڵام لەم پرســــەیە، جێــی پرسە بۆمن؟
کە هێمــــــن بۆ بەرەو خواری خوشــــیوە
هەڵۆی پیری هــــەواری کــــــــوردەواری
لەگەڵ «لەک لەک»لە کوێ دانوی کوڵیــوە

ئەمن چ بدەم وەلامی سوکە سواران
کە حەیرانن هەموو ، لێویان گەزیوە
«لە ڕەزێانی شەرانگێزی خەباتا»
چ سوار چاکێ لە ئەسپی دابەزیوە

* * *

ئەگەر تۆ دڵپڕی ، گریانە چاوت
منیش لێرە هەتاوم دارزیوە
هەوالی دڵتەزێنی شاری بانە
وەکو بۆمبا لە ناخمدا تەقیوە
لەتاو بانە منیش بریانە جەرگم
دەڵێی گورچووم مەهابادە تەزیوە
وەکو «ئاربابە» و «ئارێز» و «قەندیل»
لە ژێر باری خەما پشتم چەمیوە
منیش چەشنی هەموو دایکێکی داخدار
لەسەر چاکی «خەزایی ۱» مووم ڕنیوە
منیش بابم وەکو «داشامەجیدی ۲»
لە سوێنی زوڵمەی بەرۆکی دادڕیوە
سەرە جەستەم منیش وەک «زاوا بووکان ۳»
مژی ژانی ژوانێم هەڵمژیوە
منیش وەک جووتێ دڵداری ئەویندار
لەبن کێلا بە گۆڕ ئەشکم وەریوە

منیش زۆر بەهار وەکوو لاوی بریندار
بنیوەڕۆی دەگومەسوانی کە بەم هەڵچنیوە
منیش هەر شاعیری ئەو چوار چرایەم
کە سێبارە لە سینەی دا چەقیوە
بەڵام خۆراگرم وەک دەتاقـەندار هی
کەوا چاوی لە ئاسۆی ڕۆژی بڕیوە

* * *

دەزانم لەش سەری بۆیانە جەرگت
دەزانم دڵـپڕی چاوت گوشیوە
بەجێیە داخی خۆت ڕشتوە بەسەندام
کەمەند داوی لە سەد لاوە تەنیوە
بەڵام کێیە کە زۆر دەقتەر لە جاران
پەراسووی نیشتمانی ئەنجنیوە
ئەگەر بەشی خراپ و پیس و نەشسە
چ جێی بەحسە کەکام زیاتر گەنیوە
کە ئەو لەو لا فرۆشتی دینی ئیسلام
ئەوان ، دینیان بە پوتێک جۆ کڕیوە
ئەگەر ئەمیان دەسووتێنێ زەوی و زار
ئەوان باخ وگوڵستانیان ڕنیوە
بە لەعنەت بن چ ئی ئەم دیوو ئەو دیوو
کە جۆگەی کوردەواریان هەڵبڕیوە

لەباتی نان و کارو سەربەخۆیی
پەتەی فێڵ و درۆیان دابەشیوە
بەدی ناکەی بە غەیری پیرو پاتاڵ
ئەوەند لاویان لە زیندان ئاخنیوە
بەکوشتیان دا هەزاران کەس لە شەردا
لە پارەشدا مەپرسە چیان دزیوە
لە هەر جێیەک ببیسن لێت قسەی هەق
لەوێ ئاخوندی دم رووت پێت وەڕیوە
لە حوجرەیدا ببینە قیل و قالیان
لەسەر سیغە قسەی قۆڕو قڕیوە
لە حازر خۆری بن سێبەر چ کارێ
کە عامامەو عەبایان هەڵپشیوە

* * *

لە «شینگێریت» پەڕیوە دوژمنی گەل
ئەوەی ئێستا لە شینێت هەڵپەڕیوە
لە رژدی و خوێنرێژی و کوشتارو تاڵان
بە عومری خۆم لەویم پیستر نەدیوە
ئەگەر یانی گرە، سەددام، ئەوی تر
خودی گورگە لە پێستی مەڕ خزیوە
ئەگەر ئاغا لەوێ دەوری نەماوە
بەڵێ لێرەش مەلا شەرتی پەڕیوە

دەبوو هەردوو لە تاو بەرێن لەگەڵ یەک
کە ئاکاریان دەغەڵبازی و فریوە

* * *

دەزانی لەش سەرم بریانە جەرگم
دەزانی دڵ پڕم چاوم کوشیوە
هەتا زووە بفڕەوە بۆ لای هەواری
مەلی کوێستان لە کوێ جێگەی نشیوە
بەهاری بۆی دەکەین گەرمێن و کوێستان
ئەوەند جێی بەرزو خۆشم پشکنیوە
هەڵۆی وەک تۆ نەدەبوایە قبووڵ کا
لە روانگەیدا ببینی قەل قریوە
وەرە با پێکەوە بۆگەل بخوێنین
لە حاڵێکا کە گەلمان راپەریوە
بە ئاواتم ببینین رۆژی هەردوک
کە دوژمن هەردوو چاوی دەرپەریوە:
یەکەم ماچی گوڵینگی پەرچەمی گەل
بە دەس پاڵەو کرێکارم چەقیوە

گەواهە بۆ ئاسمانم دەورانی مەجوور
پەری قەت ناپەڕێ سەر دێو بەدڵبەرە

سەرگەوارگ، ۱۳۶۳

---

* ئەو پارچە شیعرە کاتی خۆی وەک نامە بۆ مامۆستا هێمن بەرێکراوە. هەڵبەتتبە دەستی گەیشت بەلام داخی گرانم مەرگ مەودای نەدا کە وەڵامەکەم بۆ بەرێ کاتەوە. پارچە شیعرەکە خۆی لە وەڵامی (شینگێری)مامۆستادا گوتراوە کە ئاوا دەست پێ دەکا :

*بانە وێرانە ، جگەر بریانە          دڵ پڕە، لەش سڕە چاوگریانە*

۱ کێوێکە لە سەرجادەی مەهاباد ـ ورمێ هەڵکەوتووەو زیارەتگایێکی بەم ناوەی لێیە کە خەڵک ئێستاش دەچنە سەری.

۲ کێوێکە لە رۆژهەلاتی شاری مەهاباد ،کە مەرقەدی پێشەواقازی لە داوێنی رو لە شار ـ ی ئەو کێوە هەڵکەوتووە"

۳ کێوێکە لە رۆژهەلاتی مەهاباد.

٤گۆرستانی شاری مەهابادە.

٥دارێکی کۆنساڵە لە رۆژ ئاوای شاری مەهاباد کەلەسەر جادەی مەهاباد ـ سەردەشت هەڵکەوتوە و پیرێکی لە ژێر نێژراوە.

# خوناوەی گەلاّ

خۆشمەویستم
کۆرپەی شیعرم
هەر لەورۆژەی کە زاوە
بە شیری خۆشەویستی
فێرە فرچک کراوە
هەرچەند جاریّ گریاوە
بە ئاهەنگی لای لایەی
پەری چاومەستی جوانی
لانکۆلەکەی راژاوە
لەگەلّ گزینگی بەیان
بزەی کەوتە سەر لێوان
بە هاژەی شنەی شەمال
گوێچکەی کپی کراوە
لە ترسی بردنەوەی ئالّ
مانگ و کۆ و تەرازو
بالّیان بەسەر کێشاوە
ئێستاش ئەگەر ئێواران
بەرەو ئاسۆ راماوە
پرشنگی خۆرەتاوی

لە چاوانی پرژاوە
وەرە! ئەتۆ بی و جوانیت
وەرە تۆ بی و ئەو چاوە
هەرگیز مۆرەم لیٚ مەکە
دەریای خەیاڵ و هەستم
ئاڵۆزو شلویٚ مەکە
خۆشەویستیت بەحریٚکە
پان و بەرین و بیٚ بن
گا، خورێن و پڕ شەپۆل
گا مەندو شێن و هیٚمن
گەر بیٚت و خافڵ بی لیٚم
نوقم دەبم و دەخنکیٚم.

* * *

خۆشەویستم
شاعیری ڕۆژ ئاوا نیم
هەرکە دیتم چاوی مەست وخەواڵوت
لە خانوچکەی خەیالا
خەونوچکە بم باتەوە
نا، خۆشەویستم وا نیم
هەر لەو ڕۆژەی یەکەمجار
بە ناز ئاوڕێکت داوە

تکەی گەشی خوناوەی
گەلای بەهاری جوانیم
بەسەر دلاْتکاوە
گیانی شیعرو هەلْبەستم
لە جستەتۆازیاوە
دەنگی دەنگ ووشەی من
زەنگولْ زەنگولْ فرمێسکە
لە تاوانت گریاوە
خۆشەویستیت گولْێکە
لە ناخمدا رووا‌وە
گەر بێ تۆ ، خافلْ بێ لێم
دەژاکێم و دەفەوتێم

* * *

خۆشەویستم
شاعیری رۆژهەلاْتم
لە نێو دەشتی سپی و سۆلْ
لە جوانترین ووشەی دلْ
بۆت ساز دەکەم تازاێک
خنجیلاتەو سیحراوی
هەر کەس بێتە تەماشات،
بروا بەسەو سورماوی

ئایا هەر ئەو باڵایەی
دووراو دوور راوەستاوی
یانا پەلکە زێرینەی
لە ئاسمانیٛ ئاڵاوی
یا کە بویتە ئاڵێیک
لەسەر شانی کورەی رۆژ
گەش و سوور هەڵدراوی
* * *
خۆشەویستم
ئەوکاتە،گەیشتومە مەبەستم
توشی دزیوی نەیا،
جوانیت هەتا هەتایە
هیچکەس نەوێری بڵێ:
تاکو دونیا دونیایە
خۆشەویستی درۆیە
پشتی چاوت برۆیە*.

خواکورک: بەهاری١٣٦٣

* لە فۆلکلۆر وەرگیراوە.

## رازی دەروون

داد لە دەستی خۆشەویستی پێی هەڵێنام وەرهەمیْ
کەی لە رێی دڵداری بینرا ،غەیری خوێن بیْ بەرهەمیْ
بۆنی خوێن دیْ،لەو رێگایەی بۆمەبەست گرتوومە بەر
قەت لە پێیان ناکەوم من ، بیگەمیْ یا نەیگەمیْ
ئاگری دڵ داگری خۆراگری عیشـــقم ئەمن
والە ژێر بارانی خەمدا،دائیسینم شەو،وەک شەمیْ
من لە نێو حەوشاری عیشقا هەروونم لێم دەرکەوە
پاکەهەم،سەردەم سرودی«هەق ئەنەلهەق» تا دەمیْ
خۆم لە سوێی تۆ بوومە سوتو،سودی چیە بۆم ئاو نا
وا بە ئاه و ئاخی ناخم توایەوە کێوی خەمیْ
(هێوری بۆمن بەلأیە رەنجی عیشقت خۆشە لام
لەت بەلەت بیْ دڵ بەدەردت، بیهەویْ گر مەرهەمیْ*)
والەنێو جەغزی جەماڵت نەختە نەختە توامەوە
نوختەیێکیش نیــــم بلْــێی: لاچۆ بەڵێــنیت ، نادەمیْ
گا کردەگریم تۆبە تۆبە و نا ئومێدی دامەنیْ
بەحری عیشقم هەڵدەچیْ و زێداوی لیْ دەرژیْ کەمـیْ
شاعیران بابێن بنوسن سەر گوزەشتی عیشقی من
چۆن دڵی من بوو بە دیلی خاڵ و خەت و پەرچەمیْ

وازی سووتانی دەروون دەرنایەم هەرگیز بەزار
مالی خۆمە با بسووتێنم بۆ بسووتێ عالەمی*

دەراو، ١٣٦٣

---

* ئەو دێڕەم لە حافظی شیرازی وەرگرتوە.

# تۆڵەیی جودایی*

ساقیا، زوم تێکەوە زوم تێکەوە
تەختە تەختە، نامەوێ بۆم تێکەوە
لێم مەپرسە کێم چ کارەم کوێندەریم
لێم گەڕێ چیم هەندەریم یا موشتەریم
موشتەری نیم شاعیرێکم بێ وڵات
تێکە مەی، نەمدیوە ڕوی خۆشی چ کات
مەی دەوایە بۆ زوخاوی دەردە دار
دەردەدارم ، دەردەدارم ، دەردە دار
دەردی من دەردێکی ئاسایی نییە
دەردی خۆم و دەردی تەنیایی نییە
دەردی من دەردی لە مێژینەی گەلە
ئەو گەلەی دوژمن قڕانی پێ هەڵە
دەردی بێ مافی و پەت و سێدارەیە
دەردی کوردی بێکەس و ئاوارەیە
دەردی من دەردێکی سەختەو خوێن دەڵێن
دڵ چزو گورچو ڕزو وەرهەم هەڵێن
لەو دەوایە تێکە بابیخۆمەوە
تا بە مەستی بچمە دنیای خۆمەوە

گەرچی چاری دەردەکەم نەکرێ بەمەش
قەیدی نیە بانەختێ سەرخۆش بێن ئەمەش

* * *

ساقیا ئاوردەوە، ها، وردەوە
وا خوماری هەڵمەتی هاوردەوە
چارەیێ بەربۆتە نێو دڵ ئاگرێ
قەت بە قوم قوم چاری دەردم ناکرێ
هێندە پڕ دەردم ئەگەر بوو با دەبا
بیکرم هەرچی شەراب و بادە با
بۆیە روم کردۆتە نێو مەیخانەوە
تا بە بادەم خەم لەگەڵ پەیمانەوە
ئێرەیی نیم تا رەچاو کەم چۆنە داب
لێم گەرێ بۆم دامەنێ جامی شەراب
نامەوێ ئەم کەپکەپەو ئەم دەبدەبە
پێم نیشان دە ، کوپەو دەفرو دەبە
بێڵی ئێستا سەر لە کوپەی را دەکەم
مەمکە لۆمە چادەکەم گەر وادەکەم

* * *

ساقیا رێ کل مەکە رێ کل مەکە
بێرەلام هەر پرووڵە ئی زڵ زڵ مەکە

مەی ڕەنیقی بێ نەوایە ، بێنە، وام
تا بلێی ڕوت و هەژارو بێنەوام
پیاوی بێ دەرد کوا دەزانێ قەدری مەی
دێتە نێو مەیخانە هەر شەو ، بۆ کەسەی
ڕێ مەدە قەت بادە خۆری بێ دەلیل
چیدەوێ ئینسانی گەندەو کەللە فیل
ئەو کەسانە فڕ بدەن هەر پیاڵەیێ
دێننە بیرم دەنگی ئاهو ناڵەیێ
ئەو کەسەی وا ، زگ زل و بلح و بلە
بۆ دەبێ بەرینێتە بادە وەک مڵە
ئەوکەسەی نەیزانی دەست تەنگی چیە
پیاوەتی و ویژدان و یەک ڕەنگی چیە
ئەوکەسەی وەک سەگ لەسەر پول وەرکەوێ
بۆ دەبێ مەیخانەبێ، جێی هەر شەوێ
ئەوکەسەی نەیزانی چۆنە ڕەنج و کار
هەر بە خۆشی ڕایبواردووە ڕۆژگار
ئەوکەسەی نەیدیوە ڕەنگی برسیان
ئاخ و ئۆخ و ناڵەی ژێر کورسیان
ئەوکەسەی نوستووە هەتا لای نیوەڕۆ
بۆ دەبێ بگرێتەوە جێی ڕەنجەڕۆ

ئەو کەسەی هەرگیز نەرێژێ ئارەقێ
سەیرە سەیرە، چۆن دەچێژێ ئارەقێ
ئەوکەسەی نەیبیست شەوێ ناڵەی ئەوین
ئێمە کەی هاودەنگ و هاو پیاڵەی ئەوین
ئەو کەسەی بێدەردە ساقی دور لە روت
دەک لەجێ بیکاتە ژارو ژەقنەموت
گەر دڵۆپێک بۆ دەوا بادەی دەنێ
سەیرە ئی وا،لێرە وەک با، دەی دەنێ
* * *
ساقیا، لێم لامەدە لێم لامەدە
روو لەمش کە چاوەکەم سەر بامەدە
بێنە مەی بۆمەی کڵۆڵی دور وڵات
ئەو وڵاتەی بوکی شادی لێ هەڵات
ئەو وڵاتەی کۆتری ئازادی لەوێ
کەوتە بەر شاڵاوی داڵاشی شەوێ
ئەو وڵاتەی رۆژگارێ بوو... دەمێ
بۆنی خۆشی ورەنگی شادی دێ کەمێ
داخەکەم دێوەزمە ڕوی تێکردەوە
خوێنرێژی لێی بور بە باو و کردەوە
ئەو وڵاتەی چاوی تۆی پێ ڕوون دەبوو
ئێستێ ساقی لێی دەخوێنی کوندەبو

ساقیا بۆ پێشەوە بۆ پێشەوە
ئاخۆ چەکەم بەم دڵەی پڕ ئێشەوە
بێنە مەی بۆ مەی لەسەر خاک ڕاو نراو
نیشتمانی کوت کوت و ئەنجن کراو
رامەمێنە بێنە خۆ و ئیمانەکەت
پڕکەوە بۆم، نوێ کەوە پەیمانەکەت
تۆش کە دیات گوندو شاری نیشتمان
چۆن لە ژێر بارانی بۆمبا تێکڕمان
تۆش کە دیات رۆژی تاڵی کارەسات
بۆ چزێلەک و بۆ کرۆزی نێو وڵات
مۆرنینی خوشک و دایکی مل بە کوێن:
سەرلەکوێن وەدەست لەکوێن وەمل لەکوێن
بابە هەی ڕۆڕۆ دایە هەی ڕۆ و خاڵە ڕۆ
کاکە ڕۆ ڕۆ و دادە ڕۆ ڕۆ و ڕۆڵە ڕۆ
شێت و ماخولیا دەبوی تۆش ساقیا
دات دەگرت رێگا بەرەو چۆڵ و چیا
تۆش ئەگەر چاوت لە شاری بانە، با
کورد کە چێشتی کێوی«ئاریابا» نەبا
کوا دەبا مابایە ئەمما بشتەزێ
نابەزێت و نابەزێت و نابەزێ

* * *

ســـاقیا بێـــزارەوە، بێـــزارەوە
چاوێ گل کە ئەمخەن بەلای خوارەوە
مەی ڕەفیقی بێ کەسانە، بێ کەسم
لابەری ژەنگی دلانە بێ هەسم
بێنە مەی بۆمەی طەرەبی بێ قەرار
تازەیە باری داغداری ڕەنج خەسار
تۆش ئەگەر بار گەردەلولی ڕۆژگـــار
بەربا گوڵـــزارەکەت وەرزی بەهار
تۆش ئەگەر پەڕ پەڕ بباخونچەی گوڵت
ئاگری غەم بەربا جەرگ و دڵت

تۆش ئەگەرخزم و کەست جێ هێشتبا
دەردی دووری دایک وبابت چێشـــتبا
تۆش لە زیندانێ ببان، دۆست و برات
پێم بڵێ: تۆ چیت دەکرد،خۆت و خودات
نەت دەبرد وەک من ئەتۆش بۆ مەی پەنا
مەستی خۆشە وەختی وا، وانیە دەنا؟

* * *

ســاقیـا مەی بێـــنەوە مـــەی بێنەوە
ڕووت لە کوێـیە،زوکە ، بۆ مـــەی بێنەوە

نابینم کەسێ جامێ بادەی بـــادەبدا
ئەو لەبەهارەی پڕلەی عەی بەر بادەدا
تۆش کە دێهات راوە کوورە و طوڕان مۆی
دەســـتە دەستە گرتن و ئیلســـان کوڕی
کوشتـــی پەلهار لژ کەس پێنـــکەوە
نەت دەگووت، تۆی خوەدا، بەلام تێنـــکەوە
تۆش کە دێهات گەلێو لاری شـــارەکان
سووت و خوورتی عاشق و دڵـــــدارەکان
ساوە ساوی کۆرپەڵەی ســــەر لالکێ
چاوە چاوو رۆڵە رۆڵەی دایـــــــکێ
دەی تەمزاندی رۆڵە لای لایەی شـــەوێ
پابەی رۆڵە شەرمڕۆش کۆزســتی کەوێ
تۆش کە نامەرد گرتیایان ســـــینەرت
یا بە تف ئەنگاوتیایان ســــێ بەرت
تۆش کە هەرکارێ لە دەســـتت هاتبا
کردبات و مالی خۆت نەســـــتاندبا
ئەم شەوەت بۆ مەســـتی بادەی دادەنا
یا دەنا، نا، نۆت لەســـەر دەی دادەنا
* * *
ســـاقیا، بخۆنـــەوە بـــخۆنەوە
ئاخۆ چبکەم بەم دڵەی پڕ خـــوێنەوە

هێند لەسەرمایە خەیاڵی بێ ژمار
هەر خومارم هەر خومارم هەر خومار
بێنە مەی بۆ مەی لە ڕێی عیشقا نەسیر
خەستەو مارگەستەو ئاماڵ پیر
دڵ پڕی ماڵ کاولی گورچوو بڕاو
خاوەنی خامەی کولی دەفتەر دڕاو
بولبولی گوڵ پەڕ پەڕی ویرانە ماڵ
شاعیری سەودا سەری جوانی و جەماڵ
تا دەتوانی بێنە بۆم نی توندو تاڵ
یا، بەبێنە بچمە ناو دەریای خەیاڵ
تۆش کەدییات شۆخەکوردێ خۆش خەرام
ژیکەڵەو باریکەڵەو باڵا نەمام
لارو لەنجەو ڕۆین و تۆین و خەتی
زوڵفی لول و پەرچەم و خاڵ و خەتی
دەست و پەنجەو بەژنی شوش و ناسکی
ڕاخوشین و ڕەوت و شێوەی ئاسکی
بەزمی نەزمی هێزی برژانگ و برۆ
عەزمی جەزمی کاتی ڕەزما وەک مرۆ
تەرزی ڕەمزی لێوی ئاماڵ سوورو ئاڵ
ڕازی نازی چاوی مەست و نەختی کاڵ

گـا، بەناز ئاورێکی لێ دابایـەوە
زلۆزێ سـەد جار، مردبای ژیابایەوە
سـاقیا، ئاورت دەگرت ئەو عانە تۆش
جامی میناتی نۆش دەکرد مەسعانە تۆش
یەک بەخۆت دەتکرد، هەراو هاوارو داد
هەرچی بادا هەرچی بادا هەرچـی بادا

* * *

سـاقیا، رالادەوە وا لادەوە
سـەر، سەرێ تاکەی، سـەرێ لەم لادەوە
بگرە ئەمشـۆ قەدری ئێمەی چاو لە رێ
هێمـستانە«بـادەوە»و«واوەرگـەرێ»
«واوەرە دەی وا وەرەنیـزیک بە لـێم»
چاوەرێـتم، چاوەرێتـم ، چاوەرێـم
بێنە مـەی بۆمەی قراتـووی بێ نەوا
تەڕ کەوە نەی ژەنگهەڵاتـووی بێ نەوا
هەرکەمەست بوم شەرتەوەک نەی هێمنی
بۆت بڵێم ئەو شـیعرە جوانەی(هێمن)ی
«کوردەواری ئەی وڵاتە جوانەکـەم
رۆڵـەکەم ، خێزانـەکەم ، باوانـەکەم»
خۆشەویستم دڵـبەرە نەشـمیلەکەم
ژیکەڵەی ، خشپـیلەکەی، خنجیـلەکەم

ئەی تریسکەم ئەی تروسکەم یارەکەم
یارەکەی نازدارەکەی رازدارەکەم
ئەی ئەوەی وێردی دەم و زاری منی
چاوەڕێنی دیداری تۆم وەک هێمنی
«هێمن»ێکی هات بەرەو ژوان بێتەوە
مەست وسەرخۆش وگەش و جوان بێتەوە
«هات ببینێ نیشتمان و زێدەکەی
هات ببینێ خزم و کاک و دیدەکەی»
هات بەرەو دەشت و دەرو دۆڵ و دەوار
هات بەرەو دێ و، دێمەن و، دێم و، بەراو
هات بەرەو، هویەو، هەواری کێلە شین
وەک«مەمێ» بگرێتە ئامێز«پایەزین»
هات وەکو سیامەند پەلی وردی بڕی
بۆ خەجێ هات کێوی هەڵگوردی بڕی
هات ببینێ یاری گۆزینی لەبار
یاری جوانی دورە ژوانی چاو خومار
هات کە دەیگوتەوە تابمێنێ هێزی پێم
دێم و دێم و دێم و دێم ودێم و دێم»
هات ببینێ گشت عەزیزانی وڵات
هات وهات وهات وهات وهات

هـــات بەرەو دوندی بڵیندی کێــوی لند
شاعیری گەورەی گەلی خۆش زەوقو ڕەند

هات. کە دیتی دور بە دور ڕەشپۆشە یار
هات... لە بەرزایی گلا و کەوتە خوار:

عیشـــقی پیری، بوو بە دێوی کۆنە ساڵ
گرتی ئەوکی شـاعیری ناسک خەیاڵ..

* * *

ســــــاقیا، بەس بێنە مەی بەس بێنە مەی
وابەیا، ئەیا، مەستی تۆڵـــــــــەم ئەو دەمەی

لەو گزینگەی ئێســــــــتێ وا هاتۆتە دەر
هێنشو هێنشو تێکـــــدەنێم تێشوی سەفەر

تێن دەدەم هێزو بڕســـــــت و هەستی خۆم
دێنمە دی ئاواتی بەرزوقســـــــتی خـــۆم

هەڵدەکەم قۆڵ بۆ خەباتـــــــی پڕ خەتـــەر
سەد تەلیســـم و کەندو کۆســـپم بێتە بەر
تا بمێنێ گیـــان و سەر تا ســـــەر دەڕۆم
هـــەر دەڕۆم و هـــەردەڕۆم و هـــەردەڕۆم

* * *

مەرگەوەڕۆک: گەلاوێژی ١٣٦٣

---

* ئەو پارچە شیعرەیش کاتی خۆی لەگەڵ پارچە شـــیعری( شینی شـــاعیر)بە هۆی دۆســـتێکەوە ناردرایە خزمەت مامۆســـتا هێمن ، لەهەردوو پارچە شیعردا ، مەبەستم هاندانی مامۆســـتا بوو کە خۆی دەرباز کا.هەڵبەتە هەوڵێکی زۆریـــش درا بەڵام بە داخـــەوە ئەوکارە سەری نەگرت و لەویش ناخۆشتر ئەوە بوو کە مامۆستا لەرۆژی٢٨ی خاکـەلێوەی١٣٦٥بە یەکجـاری لە جیهانی شـیعرو ئەدەب ماڵاوایی کرد. پێویستە ئەوەش بڵێم کە ئێستا لەو فکرە کە ئەوکاتی لە سەر-هاتندەروەی مامۆستا هەمبوو، پاشگەز بوومەوە-خۆزیا چەندساڵێکی تریش دە ژیا و ئەو ڕێبازەی کە بە هۆی (سروە)وە لـە ژێر چاوەدێری ئەوا لە کوردستان دامەزرا بوو زیاتر پەرەی پێدرابا.

**ئەوانەی ناوکەوانەی مامۆستاهێمن ن کە لەناڵەی جودایی وەرگیراوە

## بڕەی خوێن

*پێشکەشە بە ڕەوانی پاکی*
*قارەمانی گرتوخانەکانی ئێران*
*شەهید«عەزیزی یوسفی»*

عیشقە تەنیامەکتەبم، هیچ دەرسێ نازانم ئەمن
سەد کەرەت ڕەت بیمەوە نالێنم پەشێمانم ئەمن
عیشقی شیرین وای لەمن کرد ببمە فەرهادی زەمان
کێو لە بن بێنم بە دەنگی تیشە لێدانم ئەمن
تا پەریزادی عیشق دیل بێ بە دەس دێوی دزێو
چۆن هەدا دانم دەبێ گەر مەردی مەیدانم ئەمن
گیان لەسەردەست تێدەکۆشم چیم بەسەردێ پاشەڕۆژ
«تۆزی بانانم لە پڕ، یا خانی خانانم ئەمن*»
دێوی شەو سەدها چەلی کوشتوم لە جێژوانی کچی
« لای بەیانان دێ دەبینێ هەر هەزارانم ئەمن**»
هەم تریفەم هەم تروسکەم هەم بروسکەم هەم شەماڵ
پەلکە زێرینەی گەش و ڕەنگینی ئاسمانم ئەمن
وەرزی پایزان گزینگم هەڵدەوێژنم زوڵفی شەو
لای بەهارانیش گوڵاڵەی ئاڵی کوێستانم ئەمن
ئەو دەمەی دڵدارەکان بەدزی دەچن بۆ جێژوان
دژ بە شۆقارانی شەو پارێزەری وانم ئەمن

گا لە دەوری مانگی چاردەم هەروەکو ئەستێرەیێک
وردە وردە دێمە ژوانی یاری چاو جوانم ئەمن
هەر گوڵێکی سوور دەبینم دەبنە فرمێسک ووشەم
رامەبنە گەر وەکو شەم چاو بە گریانم ئەمن
من لە شینیش ناکەمە بەر شێعرەکانم جلکی ڕەش
شاعیرێکی سوور پەرستی سوڕی دەورانم ئەمن
دێم دەنەخشێنم بە خوێنم ڕوی بزرکاوی زەوی
غەیری بەڵگەی گیان فیدایی کوانێ تاوانم ئەمن
گەر بزەی خوێنم ببینن قەت منو ناچێ لەبیر
جەوهەری مانی گەل و بوژێنەری ژیانم ئەمن

دێریشکە: ١٣٦٣

---

* پەندی پێشینانە.
* * لە وتەکانی کاک عەزیز وەرگیراوە .

# گوڵی بێستون

*بۆ ئاغا رەزا ـ رۆڵەی نەمری کرماشانی*

گەرچی نێچیری چڵەی دێوی چنۆکی شەو ، مەنم
زەبرڕەنێک ڕەوم نابزرکێ، تاکو حەزکەی هێنمم
عەزمی رەزمم جەزمە بۆ پاراستنی بیری ڕەوام
بۆیــە مۆرەم لێــدەکا جەللادی تورەو تۆسنم
گا لە فێڵە ئەو چەوێڵە ، گا لە سمکۆڵە لەمن
تا لەبیر خۆم بچمەوە چۆن و چ بووم پێش مردنم
رەنگە ئازای بەندەنم تێک کاتەوە دوژمن بەڵام
ئەستەمە ، تێکی شکێنێ باوەری وەک ئاسـنم
هیمەتی بەرزم ئەوی ناکەم چ دەم بۆ دوژمنی
گەندەڵزکــی، چـــــاوچنۆکی ترسەنۆکی ئەوسنم
گەرچی چوکم، چۆک بە دێوی بەد فەڕی شەودادەدەم
دەچتە ژێر گڵ بۆ هەمیشە ئارەزووی روخاندنم
بیرو بڕوای گەل پەرستیم وەک هەڵۆی ئاسمانە چۆن
دێتـــە داوی داوە راوی،پیـــرە راوی،داو چـــــنم
چۆتە نێو ئێسکو پەلم تیشکی گزینگ وعیشقی خۆر
بۆیە هەردەم سروەیێک بێ ، خۆم لە خۆمدا ڕۆشنم
مەم کە کێشای جەزرەبەی زیندانی زیندەبنی دەژنو

بۆدەمێ دیداری زین بوو، چەند [illegible]

پێی دەوێ ڕێی خۆشەویستی پایەداری و پایی دار

گەر ئەوە تاوانە بۆمن ، دێم دەڵێم ها گەردنم

«گەر وەکو فەرهاد بەتاڵی گیان بدەم باکم چییە

پەس نییە خوڵقێنەری چیرۆکی خۆشی شیرنـــــــم»*

پێشکەشی ڕێی عاشقان بێ چەپکێ ، خوێنی سوورو ئاڵ

لێم قبوڵ کەن ، دیاری شەوانە ئاڵەکۆکەی پرچنم

مارە تەنگە، شەو درەنگە، گوێ لە دەنگم ڕاگرن

ڕەگ ڕەگی خوێنم دەخوێنێ بەستەی سەرکەوتنم

جەژنی سەربەستی گەلم دێ دەستە دەستە گەنج و لاو

چەپڵە ڕێـــزان، مژدە بێنـــن، بێنە ســـەر گۆڕی ونم

خۆڵی جەستەم بەرنەوە بێنـــێنە بانی بێســـتون

تا بەهـــارانم ببـــینێ یاری شـــۆخ و شـــەرمنم

سەرکەوەرۆک:١٣٦٤

---

* ئەو دێڕە لە حافظی شیرازی وەرگیراوە.

# خەمێکی تر*

بەبۆنەی کۆچی دوایی
مامۆستا هێمن شاعیری گەورەی کورد

لەنێــو باغــــی دەرونمــدا ژیــاوە وەرەمێکی تر
بەجــاری زەردی هەڵگــێرا نەمامی خۆزگەمێکی تر
هەموومــان و نەمانــی من دەمێــکە تا دەمێکی تر
« ئەگەر چی شەو درەنگە ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر
کەوا ئەم شەو سەری هەڵدا لە ناخمدا خەمێکی تر»

* * *

بەهارم زەردو بێ رەنگە لەتاو، گوڵزاری داڕوتاو
شکا باڵی مەلی شیعرم، نەهەستم ما نە تین و تاو
بەیادی گشت عەزیزانی لەسەر ئەم خاکەدا فەوتاو
« لەبادە ئەم ژەمە تێرکە منی تینوی جگەرسوتاو
بەچی دیارە کە دەبینم شەوێکی تر ، ژەمێکی تر

* * *

ولاتی پڕ تراژێدی ئەگەر ورد بێتە سەر شانۆ
دەگرێنێ دەماوەند و سەهەند و لەند و دالاهۆ
لە سوێ یان بەستە ناخوێنێ لەسەر چڵ بولبولی نامۆ
«گەلێکم رۆژگــاری تاڵ و شــیرین رابواردناخۆ
مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم سەردەمێکی تر»

پەری شـــادیم لە خوێن زیاتر،چ ناچێژێ وچ نارێژێ
لە ژانە زامی. مێژوییم، نە ئۆخژنی، نە سارێژێ
پەپولەی دڵ لە سوتانە، بەکەس ئەم رازە نابێژێ
« ئەما خانی هەتا چیرۆکی عیشقی ئێمە دارێژێ
دەنا هێشتا لە کوردستان دەژین زین و مەمێکی تر»

* * *

شەوێ پیریم لەخەوما دی ،بزرکا ڕوم کە ئەزوانیم
گوتی:تاسەر نیە بۆ کەس ، بڕا هەستی غەزەڵخوانیم
بەخێر بێ یادی جێژوانی شەوانی سەردەمی جوانیم
«گەیشتمە سەرترۆپکی ئارەزو رۆژێ کەچی روانیم
لە پێشمدایە زەردو ماهو سەخت و ئەستەمێکی تر»

* * *

نەبینـــرا بووکـــی ئـــاواتم بەتـــارا رابرێ تارام
ئەوەندەی دەستی زۆرداری خەیاڵم داگرێ، خارام
کەتا ئەم نێنە نێو گۆڕا لە گۆڕا نامرێ ئارام
«پەپولەی خۆشەویستی دڵ لە شوێنێ ناگرێ ئارام
دەنیشێ و باڵی دەبزێوێ لەســەر ســینەو مەمێکی تر»

* * *

چ ماتەمێکم لەپێناوت وەکو دێلێ لەبەر دەستت
چەماوەبوو کە پێی لادەی لەسەر عەقڵێ کە خۆت بەستت
وەرە سوێندم بە دڵداری چ بوو لەم کارەدا، قەستت
«شێوەنێکی چاوەڕوانت بووم نەهاتی گیانەکەم وەستت
منی دڵ ناسکی شاعیر بگێڕم ماتەمێکی تر»

* * *

ئەگەرچـــی رۆڵـــە کـــــوردێکی بەلادێی مەهابادیم
لەسەر دڵخوازی شیرینم دەتوێنم نەخشی فەرهادیم
کە هاتوو هەر پەری دادیش نەپرسێ دادی بێدادیم
«هەتاکوو دوا پشوو ڕێبواری ڕێگەی عیشق و ئازادیم
ئەگەر پێنجگڵە ناکامیش نەبینم بەرهەمێکی تر»

کەوەرت:بەهاری١٣٦٥

---

* لە رۆژنامەی سەردەمی نوێ ژمارە٣٩ چاپ کراوە .

** ئەواتەی لەناو کەوانەدان ئی مامۆستا(هێمن)ن کەلە پارچە شیعری ( عیشق و ئازادی)ناڵەی جودایی وەرگیراون.

# نیشتمان*

سڵاو نیشتمان ، دووری بەرچاوم
وشەی ڕەوانی شیعری شێواوم
عەرزی سەر سەوزی نەمامی هیوام
مەرزی سەربەرزی مەرامی ڕەوام
دایکی نەسرەوەی ژیان بوو ژینەر
لانکی پێشڕەوی مێژوو ڕاژێنەر
خانووی خاوێنی ئەوینی پیرۆز
بانووی چاوێنی فریشتەی دڵسۆز
ئارانی ئارای مافی ئینسانی
زۆزانی ئاڵای بەرزی یەکسانی
سەکۆی شانازی ئەرانی بوێر
مەکۆی گیانبازی کوڕانی دلێر
لەنگەری سەری سەرداری نەمان
سەنگەری بەری زۆرداری زەمان
مەیدانی سانی بۆمبا و ئاگر
زیندانی مانی گەلی خۆ ڕاگر
کەرێزی ڕوونی خوێن و فرمێسک
پەرێزی شینی کەلاک و تێسک

دەزانم چـــۆنی وەکو خۆم پەشـــێوی
خەم خۆری خامەی خامـــۆش ناحێوری
خولگەی لاوانی برســـی و بێ بەرگی
شـــەوگەی شـــالاوی خەیری مەرگی
دەشـــتی شـــەوگیری شـــایانی خەوی
دەشـــتی شـــەوارەی شـــەیتانی شەوی
مۆڵـــگەی خوێـــنی گورگی مەڕ خۆری
چۆڵگەی شـــەونی سەگی سەر شۆڕی
خەمخانەی خاوی خـــاڵۆی خەرماوی
غەمخانەی ڕاوی کەنیـــشک و لاوی
سەحنەی غەمگیـــنی کوشتاری مرۆی
سفرەی حـــەو سینی بەهاری درۆی
هاتوو بەم حاڵە ،بڵـــێن نەورۆزە
چۆنت لـــێ بکەم جەژنە پیرۆزە

سڵاو کوردســـتان ئەی زێدی بەرێز
خاکی خەبـــات و خوێن و مەتەرێز
چاوگەی زولاڵی هەســـت و خەیاڵم
راوگەی تەمـــاڵی نەیـــاری زاڵم
تێشووی دێرینی ریشـــەی ئازادیم
هێشووی شـــیرینی پیشەی فەرهادیم

خاکــــی خوێنـــاوی ئازادیخـــوازی
چاکی پیرۆزی پێشـــەوا قـــازی
شانۆی چوار پارەی شـــەڕ و چارەنووس
چوار ڕێی سێدارە و چوار چرای نامووس
هەواری هیوای پەڕیوەی شـــوێنگر
حساری برِوای پێشـــمەرگەی خوێنگر
مەزاری زاوای بێ ســـەرو بێ شوێن
مەداری داوای بووکـــــی جگەر خوێن
ژوانگـــەی یارانی وەفا نەگـــۆڕاو
ڕوانگەی بولبـــولی لەلانە تـــۆراو
«تۆدوورومن دوور، هەردو لێک دوورین»
هەردوو بەهیوای بەهاری ســـوورین
دەزانم هـــــەردەم چاوت لە دوومە
ڕێی سەربەستی بێ ئەو ڕێی گرتوومە
کە من پـــەروەردەی ئەو ئاوو خاکەم
تاهەم نیشـــــتمان لەیادت ناکەم
بۆ تۆ فێر دەبم دەرسی ســـەربازی
گیان لەسەر دەست دێنم هەرکە بخوازی
بۆتۆ دەخوێنم بەبێ ســــــــرەوتن
سرودی تۆڵەو بەســـتەی ســـەرکەوتن:

نەورۆز هاتەوە شەڵاڵی خوێنین
لە شێوەی شینی تۆی ژین دەچێنین
بە دەریایەک خوێن بە دنیایەک داخ
هەرگیزاو هەرگیز، کوێرنابێ وەجاخ
رادەخەین سفرەی حەوسینی شادی
دەگرینە ئامێز پەری ئازادی

باکۆ: نەورۆزی ١٣٦٧

* لە ژمارە/٣٨ ساڵی ١٩٨٩ی رۆژنامەی سەردەمی نوێ لەچاپدراوە

# ولاتی کــــــورد[٣]

هەتاو : خەوتوو
ئاسۆ: تاریک
وەرز: خینکاو

هەور: پیلان
سروشت : تەرم
هەوا: باروت

شەو: خەواڵو
باران : بۆمبا
زەوی: تابوت

ژیان: بۆزۆ
بژێو : ژەهر
بەرهەم : خەڵوز

دوژمن: بیژوو
ئاشتی: شاڵاو
مێژوو: خوێنین

ئەی ئاشنا سەرنج بدە
جوغرافیای ولاتی کورد
تەنگانەیە،
بگرەلانی خەباتی کورد .

باکو ١٣٦٧

---

* لە ژمارە ٢٤ی سەردەمی نوێ چاپکراوە

# خۆت خۆش*

*بەبۆنەی بۆمبارانی شیمیایی ناوچەکانی کوردستان گوتراوە کەلە جاری یەکەمدا خۆشم وەبەر کەوتم .*

کاتێ بیستم ،
زێی بادینان
ئارام ئارام
وەک دایکۆڵان
سەرتووی بزەی کۆرپەی ساوای
نێو لانکۆڵان
شەپۆل شەپۆل
رادەژەنێ
منی شاعیرچنگێ خۆڵی کام وڵاتت
کزڵان کزڵان
بۆ وەسەرکەم کوردستان
کاتێ بیستم
رووباری شین
دەریا دەریا
دڕڵ دڕڵ کوڵی
دڵۆپ دڵۆپ بوو بە هەڵم

منی شاعیر
گوڵی وشەی ئۆخژناویت
لەسەر چاوەی کام دەراوا**
زەنگوڵ زەنگوڵ
بۆ هەڵڕێژم
بێژم
خۆت خۆش کوردستان.

باکۆ:١٣٦٧

---

* لە رۆژنامەی هەوارگەی کوردەواری ژمارە/٣ سالی/١ چاپ کراوە
** چۆمێکە لە ناوچەی لۆلان و گوندێکیش بەم ناوە لە تەراغ چۆمی هەیەکەماوەیەکیش لەوێ گیرسامەوە.

## عیشق

عیشـــق دەریایە قوڵ و بـــێ بنـــە
شـــینایی مەنـــدی دڵ دە دادنـــە
بەڵام بێ بینە و بێ شـــــەپۆل برین
هەرکەس خۆی لێدا، خـۆ خینکاندنە.

*　　*　*

# نێوەڕۆک

